زەید بن الخطاب

موجاهیدی بە تەقوا...

musami 3asq

بە پێنووسی:
أبو عبد الله الكردي

ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب دەربارەی براکەی دەفەرموێت: "لە دوو شت دا پێشمکەوتەوە؛ لە ئیسلام بوونو، لە شەهید بووندا" .. !

ناوی تەواوی "أبو عَبدِ الرَّحمنِ القُرَیشِیِّ العَدَوِيّ"یە، برای ئەمیری موسوڵمانان عومەری کوڕی خەطابەو، بە تەمەن لە ئیمامی عومەر گەورەتر بوو، وە پێش ئیمامی عومەریش موسوڵمان بوو. پیاوێکی درێژی بە هەیکەلو بە شەهامەتو لە خواترس بوو.

کاتێك خوای گەورە ئیزنی موسوڵمانانی دا کە جیهاد بکەن، زەید -ڕەزای خوای لێبێت- لە یەکەمەکانی صەحابەکان بوو بۆ جیهاد. وە کاتێك نەفیر لێدرا بۆ جەنگی بەدری گەورە، زەید بەشداری لەو جەنگە کردو، شێر ئاسا هێرشی بۆ کافران دەبرد؛ تا خوای گەورە نەصرەتو سەرکەوتنی بە موسوڵمانان بەخشیو، بەو هۆیەوە ڕەزامەندیو ڕازیبوونی خوای گەورەی بەدەستهێنا.

کاتێك جەنگی ئوحود هات؛ زەید لە ڕیزی پێشەوەی موسوڵمانان بوو، بۆیە براکەی؛ عومەری کوڕی خەطاب، هاتە لایو پێی گوت: "براکەم؛ ئەو درعە بگرەو خۆتی لە تیر ورمی کافران پێ بپارێزە"، زەید وەڵامی عومەری داوەو فەرمووی: "ئەی عومەر؛ من شەهیدیم دەوێت، پێویستم بە درع نییە تۆ چیت دەوێ؟!".

اِبـنُ عُمَـر -ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرموێت: "لە جەنگی ئوحود؛ باوکم درعەکەی خۆی داکەندو دایە مامم زەیدو، پێی فەرموو: سوێندت دەدەم ئەو درعەی من بپۆشی! زەیدیش درعەکەی وەرگرتو پۆشیو پاشان دایکەند! ئیمامی عومەر فەرمووی ئەوە چییە؟! گوتی: من بۆ نەفسی خۆم دەمەوێت، ئەی تۆ بۆ نەفسی خۆت چیت دەوێ؟ مەبەستی شەهادەت بوو.

دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ کاتێك شەڕی هەڵگەڕاوەکان هات، زەیدی کوڕی خەطاب بەشداری لەو جەنگەدا کرد کە بە جەنگی "یەمامە" ناسراوە. لەو شەڕەدا موسوڵمان تووشی شکست هاتن لە سەرەتا، بۆیە هەندێك لە موسوڵمانان لە مەیدانی جەنگ هەڵاتن. زەیدی کوڕی خەطاب بە هەموو هێزی هاواری دەکرد دەیفەرموو: خودایە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم لە هەڵاتنی هاوڕێکانم لە مەیدانی جەنگەوەو، من بەریم لەوەی کە موسەیلەمەی درۆزن هێناویەتی... پاشان سوێندی خوارد کە قسە نەکات، تا خوای گەورە سەرکەوتنیان پێ دەبەخشێ، یانیش دەگەڕێتەوە لای خوای گەورەو قسە لەگەڵ خوای گەورە دەکات!

بۆیە ئاڵای ئیسلامی لە دەست گرتو، هێرشی کردە هەڵگەڕاوەکان... ئەوە بوو تا شەهید بوو جەنگاو چەندین کەسی لە کافرەکان کوشت، تا لە کۆتایی دا شەهید بوو، وە خوای گەورە سەرکەوتنی بە موسوڵمانان بەخشی.

# زيد بن الخطاب

## موجاهیدی بە تەقوا...

musami 3asq

دوای سەرکەوتن؛ موسوڵمانان گەڕانەوە مەدینە، ئیمامی عومەر سەیری کرد کە زەید دیار نییە؛ لێی پرسی... گوتیان موژدەت لێبێت ئەی عومەر براکەت شەهید بوو! ئیمامی عومەر دەستی بە گریان کردو فەرمووی: لە دوو شت دا پێشتم کەوتەوە؛ لە ئیسلام بوونو، لە شەهید بوون‌دا.

ئیمامی عومەر چاوی بە بکوژی براکەی کەوتو پێی گوت: هاوار بۆ تۆ؛ برایەکت لێ کوشتم کە هەر کاتێك بای سەبا دێت، بۆنی زەیدی کوڕی خەطابی برام دەکەم!

خوای گەورە لە ئیمامی عومەرو زەیدی برای‌و هەموو صەحابەکان ڕازی بێتو، خوای گەورە ئێمەش بگەینێت بەوانو، لەگەڵ پێغەمبەرﷺ وصەحابەکان حەشرمان بکات.



@Gizing_Net

پێگەی گزنگ

پێگەی گزنگ؛ مینبەرێکی مەنهەجییە، بۆ گەیاندنی پەیامی یەکتاپەرستیو جیهاد .. ئاسۆی ئەو بەیانەیە کە بە ڕووناکی هەڵهاتنی؛ ئوممەت لەدەردی وەهنو حاڵی غەریبی ڕزگار دەکات.



2017 _ 1439